وتاری یازده

زنجیره وتاری (شیرک و شیرکی گوێرایەڵی کردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## الديمقراطية وعلاقتها بالإسلام

## دیموکراسی و پەیوەندی بە ئیسلام

وتاری شیخ

أبو علي الأنباري تقبله الله

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (یازدە)

بەناونیشانی
# دیموکراسی و پەیوەندی بە ئیسلام

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە حوججە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت..

قسەمان کرد بە شێوەیەك کە شتێك لە ڕوونکردنەوەی تیادابوو دەربارەی سەرخەرانی تاغوتان بە زمان، ئینجا قسەمان دەربارەی هۆکاری دابەشکەری هاوبەش لە نێوان سەرخەرانی تاغوتان بە زمان دەبێت، دابەشکەری هاوبەش لە نێوان ئەو وتاربێژانە دەبێت جا یەکسانە لە مورجیئە بن یان ئیخوانی میصر یان کلکەکانیان، یان لە سۆفی یان هەر یەکێك لەو وتاربێژانەی وتار دەدەن لەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە نین، بانگەوازیان بۆ دیموکراسییە، وە توندترین بانگخوازان بۆ دیموکراسی لە کۆن و ئێستادا بریتیین لە ئیخوانی میصر، هەر بۆیەش دەیانبینی هەمیشە ئەمە دەڵێنەوە ئیسلام دینێکی دیموکراسییە، هەمیشە ئەم وەسفە دەبینی بەم شێوەیە لە قسەکانیان و لە پەڕتوکەکانیان و لە وانەکانیان و لە وتارەکانیان، جا ئایا ئەم دیموکراسییە چییە کە ئەمریکا بانگەوازی بۆ دەکات بە هێزی چەك و سوپا، وە بۆچی ئەوانەش بە دیموکراسی دەڵێن کە ئیسلام دینێکی دیموکراسییە؟

پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: وتەیەکی عبد القادر عبد العزیز هەیە لە پەڕتوکەکەی "الجامع" داواکارین لە الله تعالی ڕێنوێنی بکات بۆ ژێرییەکەی و بیگێڕێتەوە بۆ ژێرییەکەی و هیدایەتی بدات، هەندێك پاشگەزبوونەوەی هەیە لە بەندیخانەکانی میصر، باسی وتەیەکی کردووە لەبارەی چۆنیەتی ناسینی مانای دیموکراسی جا دەڵێت -وتەکەی بە مانا دەگوازمەوە نەك بە دەق- : ئێمە ئەگەر بمانەوێت مانای وشەیەك لە وشەکان بزانین و لەنێویاندا دیموکراسی ئەوا ئەو سەرچاوانەی دەگەڕێمەوە بۆ لای: زمانی عەرەبییم لەبەردەستە، شەرعم لەبەردەستە، نەریتم (العرف) لەبەردەستە، دەکرێت لە مانای وشەکە تێبگەم لە ڕێگەی یەکێك لەم سەرچاوانە، بۆ نموونە: نوێژ (الصلاة) لە زمانی عەرەبی بە مانای پاڕانەوە (الدعاء) دێت، بەڵام نوێژ (الصلاة) لە شەرعدا بریتییە لەو عیبادەتەی بە تەکبیرەی ئیحرام دەست پێدەکات و بە سەلامدانەوە کۆتایی دێت، کەوایە ئەمە تێگەیشتنێك بوو لە ڕووی زمانەوانییەوە و ئەوەی

تریش تێگەیشتنێك بوو لە ڕووی شەرعییەوە، وە هەندێك چەمك هەیە بۆ هەندێك لە دەستەواژەکان کە ناسراوە لە لای خەڵك و کۆکن لەسەری جا خەڵکی ناوچەیەك بێت یان خەڵکی گەڕەکێك بێت یان خاوەن پیشەیەك بن لە پیشەکان، دەبینی هەندێك وشە و زاراوەیان هەیە کۆکن لەسەر بەکارهێنانی، بۆیە ئەگەر بمانەوێت مانای دیموکراسی بزانین ئەوا ئەو بوارانەی دەگەڕێمەوە بۆ لایان: دەگەڕێمەوە بۆ لای زمان، وە دەگەڕێمەوە بۆ لای شەرع، وە دەگەڕێمەوە بۆ لای نەریت جا دەگەڕێم کە ئایا ئەم وشەیە هیچ مانایەکی هەیە لەم سێ سەرچاوەیەی دەگەڕێمەوە بۆ لایان، کاتێك دەگەڕێیتەوە بۆ لای پەڕتوکەکانی فەرهەنگ و زمانەوانی هیچ ڕاڤەکردنێکت بۆ دیموکراسی دەست ناکەوێت؛ چونکە وشەیەکی ئەعجەمییە و عەرەبی نیە، وە کاتێك دەگەڕێیتەوە بۆ لای شەرعی پاك و بێگەرد هیچ ڕاڤەیەکت بۆ دیموکراسی دەست ناکەوێت چونکە لە دینی ئێمەدا نیە نە کەم و نە زۆر، کەوایە ئێستا من دوو هۆکاری تێگەیشتنم بەکارهێنا بۆ تێگەیشتن لە وشەی دیموکراسی، پاشان توێژینەوە دەکەم لەوەی ئایا موسڵمانان کۆکن لەسەر مانایەکی دیاریکراو بۆ دیموکراسی لە نێو خۆیاندا؟ ، ئەمە لەو وشانە نیە کە موسڵمانان کۆك و یەك دەنگن لەسەریان لەنێو خۆیاندا، کەوابوو سەرچاوەکانم یارمەتیم نادەن لە زانینی مانای دیموکراسی، جا ئەگەر حاڵەتەکە بەم شێوەیە بێت، کەوایە هیچم لەپێش نیە تەنها ئەوەی پێویستە بگەڕێمەوە بۆ خاوەنەکانی ئەم وشەیە، بۆ قاموس و فەرهەنگەکانیان و بگەڕێم لەوەی ئەوان چۆن ئەم وشەیەیان ڕاڤە کردووە و چییان وتوە دەربارەی، عبد القادر بن عبد العزیز دەڵێت: ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پەڕتوکەکانیان و فەرهەنگەکانیان و پەڕتوکەکانی زمانەوانی ئەوان دەبینین ئەوان پێناسەی دیموکراسی دەکەن و ڕاڤەی دەکەن بەم شێوەیە "دیموکراسی واتە سەروەری بۆ گەل"، ئێمە تێدەگەین لە مانای گەل، ناکۆکی و جیاوازی نیە لە تێگەیشتنی ئەم وشەیە، بەڵام لەوانەیە ناکۆك بین لە تێگەیشتنی مانای سەروەری (السيادة)، کەوایە ناچار دەبیت جارێکی تر بگەڕێیتەوە بۆ لای پەڕتوکەکانیان هەتا بزانیت مەبەستیان چییە لە وشەی سەروەری کاتێك بەکاریان هێناوە لەم شوێنەدا، جا (السيادة)ـی پەیوەست بە دیموکراسی لە پەڕتوکەکانیان و لە فەرهەنگەکانیان واتە "بریتییە لەو دەسەڵاتەی کە هیچ دەسەڵاتێکی تر لەسەرووی ئەوەوە نیە" کەوایە پێناسەی دیموکراسی لە لای ئەهلەکەی بریتییە لە سەروەری بۆ گەل، وە مانای سەروەریش (السيادة) لە لای ئەوان وتی: بریتییە لەو دەسەڵاتەی کە هیچ دەسەڵاتێکی تر لەسەرووی ئەوەوە نیە، ئەمە پێناسەی دیموکراسی بوو لە لای ئەهلەکەی.

وە بەهۆی ئەوەی وڵاتانی موسڵمانان ئێستا دەیانەوێت حوکمیان پێبکرێت بەو قانون و دیموکراسیانە، بۆیە ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ دەستور دەبینی کە پێناسەی دیموکراسی دانراوە لە ماددەکانی دەستور، بۆ نموونە: لە قانونی میصڕی، ماددەی سێیەم دەڵێت -بە دەقەکەی- : "سەروەری بۆ گەلە بە تەنیا و

سەرچاوەی دەسەڵاتەکانیشە"، ئەمە لە قانونی میسڕی کە هەمان پێناسەی دیموکراسییە لە لای ڕۆژئاوا، وە هەروەك دەبینی کە تەشریعدانەری میسڕی الله ڕیسوای بکات نەوەستاوە بەوەی بڵێت: سەروەری بۆ گەلە، بەڵکو جەخت لەسەر شتەکە دەکاتەوە بە زیادکردنی وشەی "وحده" (السيادة للشعب وحده)، هەتا هیچ کەسێك گومان نەبات کە لەگەڵ گەل لایەنێکی تر هەیە و سەروەری بۆ ئەوانیش بێت، بۆیە وشەی "وحده"ـیان هێناوە وەك لێوردبوونەوەیەك لە تێگەیشتنی مانای دیموکراسی لە ڕێگەی دەستور، بەڵام لە قانونی عێڕاقی ماددەی پێنجەم بەم شێوەیە نووسراوەتەوە: "سەروەری بۆ قانونە و گەلیش سەرچاوەی دەسەڵاتەکان و شەرعیەتیانە" ، کەوایە ئەوەی ناسراوە لە لای ڕۆژئاوا لە قانون و دەستورەکاندا هەیە، سەبارەت بە قانونی میسڕی بابەتەکە ڕوون و ئاشکرایە، گونجاوە لەگەڵ پێناسە ڕۆژئاواییەکە سەد لە سەد، بەڵام لە قانونی عێڕاقی نەیانوت سەروەری بۆ گەلە، بەڵکو وتیان سەروەری بۆ قانونە، جا ئایا هیچ جیاوازیێك هەیە لە نێوان سەروەری بۆ گەل و سەروەری بۆ قانون لە کارکردن بە دیموکراسی؟ سەرنج بدە، بەهۆی ئەوەی گەل سەروەری بۆ ئەوانە، ئەم گەلەن کەوا ئەو قانونە پەسەند دەکەن کە حوکمی پێدەکەن، سەروەری بۆ قانون نابێت تەنها دوای دەنگدانی گەل لەسەری نەبێت، کەوایە قانون ناکاتە هیچ بەبێ پەسەندکردنی گەل، جا تەشریعدانەری عێڕاقی کاتێك وتی "سەروەری بۆ قانونە" ئەمە مانای ئەوە نیە قانون لەسەرووی گەلە چونکە ئەم قانونە کاری پێناکرێت و ئاوڕی لێ نادرێتەوە ئەگەر گەل ئەم قانونە پەسەند نەکات، کەوایە ئەو قانونەی سەروەرییان بەو داوە ئەوا لە بەرهەمی گەلە، گەل پەسەندی قانونەکە بکات ئەوە حوکمی پێدەکرێت، گەل پەسەندی قانونەکە نەکات ئەوە حوکمی پێناکرێت، کەوابوو گەڕاینەوە بۆ پێناسەی دیموکراسی و گەڕاینەوە بۆ ئەو ڕاشکاوییەی هەیە لە لای تەشریعدانەرە میسڕییەکان کە سەروەری بۆ گەلە چونکە ئەم قانونە کاری پێناکرێت بەبێ پەسەندکردنی لە لایەن گەلەوە، وە تەشریعدانەری عێڕاقی بە هەمان شێوە پێناسەی دیموکراسی کرد بەڵام لە جیاتی گەل نووسیویەتی قانون.

سەبارەت بەوەی چۆن حوکم بۆ گەل دەبێت؟ کەوایە ئێستا تێگەیشتم لە مانای دیموکراسی لە لای ڕۆژئاوا و تێگەیشتم لە مانای دیموکراسی لە دەستوری میسڕی و لە دەستوری عێڕاقی، بەڵام ئەی چۆن سەروەری بۆ گەل دەبێت لە وڵاتانی دیموکراسی؟ پرۆسەیەکیان داناوە، ئەم پرۆسەیەش پێی دەوترێت پرۆسەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەل، وە نوێنەرانی گەل ئەوانەن کە ئەم زاراوەیەیان بۆ بەکاردەهێنرێت و ناویان لێناون دەسەڵاتی تەشریعی -بەبێ ئابڕووانە- وە ناویان لێناون ئەنجومەنی نیشتیمانی، وە ناویان لێناون ئەنجومەنی گەل، وە ناویان لێناون ئەندامانی پەرلەمان و ناویان لێناون نوێنەران، هەموو ئەو ناوانە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەو کەسەی گەل هەڵیدەبژێرێت بۆ حوکم، وە ماددەیەك هەیە لە قانونی

عێراقی، ماددەی چل و حەوت کە بەم شێوە دانراوە دەڵێت: "ئەنجومەنی نوێنەران پێکدێت لە ژمارەیەك لە ئەندامەکان سەبارەت بە یەك کەس بۆ هەر سەد هەزار کەسێك لە کەسانی عێراقی کە نوێنەرایەتی تەواوی گەلی عێراقی دەکەن، هەڵدەبژێردرێن لە ڕێگەی دەنگدانی گشتی نهێنی ڕاستەوخۆ و ڕەچاوی نواندنی هەموو پێکهاتەکانی گەل تیایدا دەکرێت". ئەم ماددەیە چییە؟! ئێمە وتمان کە سەروەری بۆ گەلە واتە حوکم و دەسەڵات لە ڕێگەی گەلەوە دەبێت، چۆن سەروەری بۆ گەل جێبەجێ دەکرێت لە وڵاتی دیموکراسی؟ دێن حیزبەکان پێکدەهێنن، دوای پێکهێنانی حیزبەکان -کە قانونێك هەیە لە پێکهێنانی حیزبەکان، جا هەر کۆمەڵەیەك ڕەزامەندی بەدەستهێنا لەسەر پێکهێنانی حیزب ئەوا دەبینی ئەوانە هەندێك بەرنامەیان هەیە و هەندێك کارنامە وبیرۆکەیان هەیە بەوەی دەڵێن ئێمە ئاوا دەکەین ئەگەر چووینە پەرلەمان لە چوار ساڵی داهاتوو- دوای ئەمە ئەوانە ناوەکانیان دەخەنە ڕوو بۆ هەڵبژاردنەکان، وە خەڵك ئەوانە هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی ببن بە نوێنەریان لە پەرلەمان، بۆیە دەبینی فڵانە حیزب چوار ملیۆن دەنگی بەدەستهێناوە لە دەنگەکانی گەل و یەکێکی تر پێنج ملیۆنی بەدەستهێناوە و یەکێکی تر دە ملیۆنی بەدەستهێناوە، کەوایە ئەوانەی پاڵێوراون بۆ چوونە پەرلەمان، گەل هەڵیاندەبژێرن، بۆیە ئەو ئەندامانە بە نوێنەری گەل لە قەڵەم دەدرێن لە حوکمدا، هەر بۆیەش کاتێك بەیاننامەیەك یان بڕیارێك دەردەکەن ناڵێن "بسم الله الرحمن الرحيم" بەڵکو دەڵێن "باسم الشعب - بەناوی گەل"، بۆچی؟ چونکە ئەوانە هەر یەکێکیان نوێنەرایەتی سەد هەزار عێراقی دەکات، سەیری دەوڵەتانەکانی تریش بکە چەند بە مەرج دادەنێن چونکە ژمارەی دانیشتوان دابەش دەکرێت بەسەر ژمارەی نوێنەران (سێ سەد و پەنجا) ئەو کاتە دەزانن هەر نوێنەرێك نوێنەرایەتی چەند کەس دەکات لە خەڵکی ئەو وڵاتە، کەوایە بەم ڕێگەیە کاتێك ئەوانە حوکم دەکەن ئەوا حوکم دەکەن بەناوی گەل، بەمەش سەروەری بۆ گەل بوو لە ڕێگەی نوێنەرەکان لە پەرلەمان، زانیت دیموکراسی چۆن سەروەری دەدات بە گەل؟ ئەگەرنا گەل ناکرێت هەموویان ئەو دەسەڵاتە بن کە هیچ دەسەڵاتێکی تر لەسەرووییەوە نیە، بەڵکو دەبنە دەسەڵات لە ڕێگەی ئەوانەی نوێنەرایەتییان دەکەن لە پەرلەمان، وە لە شتە پێکەنیناویەکان ناڵێم گریاناویەکان ئەگەر بزانی حاڵی ئەندامانی پەرلەمانی عێراقی چۆنە! ئەوانە نوێنەرایەتی گەل دەکەن و حوکم دەکەن بەناوی گەل وە بڕوانامە ساختەکانیش بدوێ لەبارەیەوە بە ئارەزووی خۆت.

کەوایە ئێستا دەتوانم ڕوونی بکەمەوە کە دیموکراسی لە حوکمدا مانای چییە، بەوەی کە هەر گەلە ئەو دەستورەی حوکمی پێدەکەن پەسەندی دەکات -ئەمە سەروەرییەکە-، بەوەی کە هەر گەلە ئەندامانی ئەو حکومەتە هەڵدەبژێرن کە حوکمی گەل دەکات، بەوەی کە هەر گەلە حوکم دەکات لە ڕێگەی ئەوانە،

ئەمە مانای دیموكراسییە، وە گەل چاودێری حكومەت دەكات و تا چەند پابەندن بە قانون لە ڕێگەی نوێنەرەكانیان، وە گەل مافی ئەوەیان هەیە حكومەتەكان هەڵبوەشێننەوە چونكە شەرعیەتەكەیان -ئەو حكومەتانە شەرعیەتەكەیان وەستاوە- لەسەر ویستی گەل، بۆیە گەل ئەگەر بیانەوێت حكومەتێك لەو حكومەتانە هەڵبوەشێننەوە ئەوە بۆیان هەیە وا بكەن ئەگەر سەرپێچی كردنی قانونیان هەبوو -سەرپێچی كردنی دەستور- یان ئەگەر حكومەت ئەو بەڵێنانەی دابووی بەجێنەهێنێت، ئەو كاتە لە مافی گەلە كار بكات لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەو حكومەتە، كەوابوو بەو سیفەتانەی باسم كرد وا دەكات سەروەری بۆ گەل بێت.

باسی دیموكراسی تەواو دەكەین و باسی قانونی عێراقی و میصری تەواو دەكەین، بۆیە ئێستا دەڵێم: دیموكراسی بەم مانایەی باسم كرد -سەروەری بۆ گەل- لە وڵاتانی موسڵمانان وەرگێڕدراوە لە لایەن ئەو تاغوتانە، دیموكراسی واتە: حوكم بۆ گەلە، وە هەندێك جاریش: حوكمی گەل بۆ گەل، جا بەم دوو ڕاڤەكردنە ڕاڤەی دەكەن، ئێستا ئەگەر بۆم چەسپا كە دەسەڵات و حوكم بۆ گەلە، ئەمە پێناسەی دیموكراسییە، پەیوەندی ئەم پێناسەیە چییە بە ئیسلام -دەسەڵات و سەروەری و حوكم بۆ گەل- ؟ توێژینەوە بكە دەربارەی ئەم بابەتە لە پەڕتوكی الله عز وجل و سوننەتی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) دەبینی كە ئەم پێناسەیە دژ و جیاوازە بە دژیەكبوونێكی تەواو لەگەڵ فەرمودەی الله تعالى﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠﴾[(١)] ، واتە: گشت حوكم و بڕیارێك تەنها وتەنها هەر بۆ الله ـیە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی كەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەش دین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵكی ئەم ڕاستیانە نازانن و لێی بێئاگان.

كەوایە دیموكراسی هیچ پەیوەندییەكی نیە بە ئیسلام لە ڕووی پێناسەوە، هیچ پەیوەندییێك نیە، ڕوونە إن شاء الله ؟ والحمد لله.

دێینە سەر قانونی میصری و قانونی عێراقی دەڵێت: "وە گەل بریتییە لە سەرچاوەی دەسەڵاتەكان و شەرعیەتیان"، ئەمە لە قانونی عێراقی بەڵام لە قانونی میصری: "سەروەری بۆ گەلە بە تەنیا و هەر ئەویش سەرچاوەی دەسەڵاتەكانە"، لێرەدا مانای (دەسەڵاتەكان) چییە، وە مانای (سەرچاوە) چییە، وە مانای (شەرعیەت) چییە؟

مەبەست لە دەسەڵاتەكان لێرەدا، بریتییە لەو سێ دەسەڵاتەی حكومەتە دیموكراسییەكانی لێ پێكهاتووە، دەسەڵاتی تەشریعی: ئەوانەش ئەندامانی پەرلەمانن، پێیان دەڵێن "دەسەڵاتی تەشریعی" كە ئەم

(١) یوسف: ٤٠

دەسەڵاتەیە تەشریعەکان دادەنێت، وە دەسەڵاتی جێبەجێکردن هەیە: وە ئەوانەش بریتیین لە وەزیرەکان و بریکارەکان و بەڕێوەبەرە کارگوزارەکان و ئەوانەشی نوێنەرایەتییان دەکەن، وە دەسەڵاتی بڕیاردان: مەحکەمە و پیشەی پارێزەری و هاوشێوەی ئەمانە، کەوایە قانونی عێڕاقی و میصڕی و تەواوی دەستورەکان هەموویان وایان داناوە و نووسیویانەتەوە کە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە، واتە ئەم دەسەڵاتانە دروست نابن تەنها لە ڕێگەی گەل نەبێت، بۆیە گەل ئەندامانی حکومەت هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی حوکم بکەن، ئەمە مانای "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە"، واتە ئەگەر گەل کەسانێکیان هەڵنەبژارد حوکمیان بکەن ئەوا هیچ یەکێك حوکمیان ناکات، وە ئەگەر کەسانێکیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی حوکمیان بکەن کەوایە ئەوانەی هەڵبژێردراون لە ڕێگەی گەل هەر ئەوان حوکم دەکەن، ئەمە لە دیموکراسی.

وە لە بیر نەکەی کاتێك دەڵێت: "گەل سەرچاوەیە" هەموو کۆمەڵە و هەموو دینەکان و هەموو ئەو حیزبانەی هەیە لە وڵاتدا دەچێتە نێو وشەی گەل، جا کاتێك تەشریعدانەری عێڕاقی -اللّٰه ڕیسوایان بکات- دەڵێت: "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە" بپرسە: حاڵی گەلی عێڕاقی چۆنە؟ لە سەدا ئەوەندە ڕافیضەیە، لە سەدا ئەوەندە نەساڕایە، ئاشورییەکان، کلدانیەکان، سابیئە، شیوعیەکان، عەلمانیەکان، نەتەوەپەرستەکان، ئێزیدی، هەموو ئەوانە دەچنە نێو بازنەی گەل، کەوایە ئەو پێکهاتانە هەموویان لە وڵاتەکەماندا ئێستا سەرچاوەی دەسەڵاتن، واتە دەسەڵات دەردەچێت لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئەو خەڵکانە و هەموو ئەوانەش مافیان هەیە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی حوکم دەکات، "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە".

سەبارەت بە میصڕ -بە نموونە- قەشەکان بەشداری دەکەن لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی حوکمیان دەکات، بۆچی؟ چونکە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە، وە هەروەها لە هەموو وڵاتەکان، ئەمە لە دیموکراسی، ئەی هەڵوێستی ئیسلام چۆنە لە هەڵبژاردنی کاربەدەستان؟

، زانیهان کە گەل بە هەموو پێکهاتەکانیەوە: بە دینەکانیان و بە کۆمەڵەکانیان و بە حیزبەکانیان و بە مورتەدەکانیان و بە عەلمانییەکانیانەوە، سەرچاوەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتن، ئەمە لە دیموکراسی ئەی هەڵوێستی ئیسلام چۆنە لە هەڵبژاردنی کاربەدەست و دەسەڵاتداران؟

کاربەدەستان و دەسەڵاتداران لە ئیسلامدا حوکم دەکەن بە یەکێك لەم سێ ڕێگەیە: یان بە وەسیەتێك لەوەی پێشووەوە بۆ ئەوەی دێت، واتە دەبێت پێشەوای ئیهانداران یاخود خەلیفە یاخود حاکم یاخود دەسەڵاتدار وەسیەت بکات کە خەلیفە لە دوای من فڵانی کوڕی فڵان دەبێت، کەوایە ئەمە پۆستی پێشەوای وەرگرت بە وەسیەت، بۆیە ئێستا هیچ پەیوەندییەکهان نیە بە دیموکراسی، بۆچی؟ چونکە ئەمە

یەکێکە لە هۆکارەکانی چەسپاندنی حوکم لە ئیسلامدا، وە بەڵگەی ئەمەش کە (أبو بكر الصديق(ﷺ)) کاتێك کاتی مردنی نزیك بووەوە وەسیەتی کرد بەوەی لە دوای خۆی پۆستی خەلیفە بدرێت بە فاروق عمر (ﷺ)، کەوایە ئەمە رێگەیەکی شەرعییە لە ڕاسپاردنی کارەکە لەناو وڵاتانی موسڵمانان، وە ئەمەش بە ئاگاداربوونی هەموو صەحابە بوو -ڕەزای الله لەسەر هەموویان بێت- ئەوانەیان کە زیندوو بوون، وە کۆڕا و ئیجماعیش هەبوو لەسەر ئەم کارە، ئەمە ڕێگەیەك بوو.

ڕێگەی دووەم: بریتییە لەوەی دەسەڵاتدارە موسڵمانەکە بابەتەکە بکاتە ڕاوێژپێکردن (الشورى) بۆ دوای خۆی، واتە کۆمەڵێك کەس هەڵدەبژێرێت و دەڵێت: لە نێو ئەوانەدا پیاوێك هەڵدەبژێرن بە ڕاوێژکردن کە هەر ئەمە بوو ئیمامی عمر (ﷺ) کردی کاتێك لە نوێژدا لێیدرا و زانی کە مردنی نزیك بووەتەوە، بۆیە شەش لە صەحابەی هەڵبژارد و وتی: ئەوان ڕێك دەکەون لەسەر پیاوێك لە نێو خۆیاندا، کەوایە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداری کردە ڕاوێژکردن، بۆیە یان بە وەسیەت یان بە ڕاوێژکردن، ئەمە بریتییە لە ڕێگەی شەرعی لە ڕاسپاردنی کارەکە سەبارەت بە موسڵمانان لە وڵاتانی ئیسلام.

بەڵام ڕێگەی سێیەم کە ڕێگەی زاڵبوونە بە شمشێر: بریتییە لەوەی یەکێکیان بە هێز و بە شمشێر بێت و دەست بگرێت بەسەر شوێنێك و پاشان ڕاییگەیەنێت کە ئەو دەسەڵاتدارە بەسەر ئەم شوێن و ناوچەیە، وە ئەمەش بە هەمان شێوە پێشەوایە و لە ڕووی شەرعییەوە دانی پێدادەنرێت؛ چونکە توانیویەتی بە هێز و بە زاڵبوون شەرعی الله عز وجل بەرپا بکات و جێبەجێی بکات لە شوێنێك لە شوێنەکان بۆیە دەبێت گوێی بۆ بگیرێت و گوێڕایەڵی بکرێت، کەوابوو ڕاسپاردنی کاروبار بە دەسەڵاتداران لە ئیسلامدا یان بە وەسیەتە یان بە ڕاوێژکردنە یان بە زاڵبوون و هێزە جا ئەمەی وتم لە کوێدایە لە دیموکراسی؟ ئەم قسەیە لە کوێی دیموکراسیدا هەیە؟ "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە" لە کوێیە؟ بۆیە هیچ پەیوەندییەکی بە دیموکراسییەوە نیە لە هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران، ئەمە باسێك بوو.

باسێکی تر، لە وڵاتانی دیموکراسی دەڵێت: "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە" کەوایە لە مافی گەلە هەر ئینسانێك بێت هەڵیبژێرن بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەریان و دەسەڵاتدار بەناوی ئەوان بە چاوپۆشی کردن لە دین، وە بە چاوپۆشی کردن لە کوفر و ڕیدە و ئیسلام، دین لە ڕێکخەرەکانی هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران نیە لە لایەن گەلەوە، بە بەڵگەی ئەوەی ڕافیضە بوونیان هەیە و نەساڕا بوونیان هەیە، وە هەروەها پێکهاتەکانی تریش بوونیان هەیە، وە حیزبی شیوعی بوونی هەیە، کەوایە تیایاندایە لەسەر دینێکی شیرکییە و تیایاندایە لەسەر دینێکی مەنسوخە -کوفر- وە تیایاندایە هیچ دینێکی نیە -وەك شیوعیەت- بۆچی؟ لەبەرئەوە ئەم پێکهاتەیە هاتۆتە کایەوە چونکە گەل بۆ ئەوان سەرچاوەی دەسەڵاتەکانن، جا

ئەگەر سەرنج بدەی لە پێکهاتەی پەرلەمانی عێراقی تووشی سەرسوڕمان دەبیت، ٣٥% ئافرەتن! ، خێر لە گەڵێکدا نیە کاروباری بداتە دەست ئافرەت فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ)[١]،ئەمە دەروازەی یەکەم بوو.

دەروازەی دووەم: لە پاڵ خاوەنی عەمامە و جوبە و ڕیشی سپی ئێزیدیێك دەبینی یان نەسڕانییەك، ئەمە لە دیموکراسی، ئەم کارە بخەرە بەردەم ئیسلام، دەسەڵاتداری موسڵمان هەر خۆی کەسێك هەڵدەبژێرێت یارمەتی بدات لەسەر هەڵگرتنی ئەم ئەمانەتە، چونکە ئەمە ئەمانەتێکە، وە ڕێکخەری هەڵبژاردن لە لای دەسەڵاتداری موسڵمان، ئەو فەرموودەیەیە کە عبد الله بن عباس (رضي الله عنهما) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی: "من استعمل رجلا من عصابة وفي العصابة من هو أرضى لله منه فقد خان الله وخان الرسول وخان المؤمنين" واتە: هەر کەسێك پیاوێك بکاتە بەرپرس لە کۆمەڵێك و لە کۆمەڵەکەشدا کەسێکی شایستەتری تیادا بێت لەو ئەوا خیانەتی لە الله و خیانەتی لە پێغەمبەر و خیانەتی لە ئیمانداران کردووە[٢]., جا ئەگەر زانیت کە دەسەڵاتداری موسڵمان هیچ شتێك لە کاروباری موسڵمانان ناسپێرێت بە ئافرەتان، ئەمە جیاکەرەوەی یەکەمە، وە کەس پێش ناخات تەنها ئەو کەسە نەبێت کە شایستەیە بۆ ئەوەی پێش بخرێت، ئەگەر کەسێکی پێش خست شایستە و گونجاو نەبوو ئەوا خیانەتی لە الله و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران کردووە، ئەمەش ڕێکخەرە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی هاوکاری دەسەڵاتدار دەکات لە ڕاپەڕاندنی کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەت، بەڵام بەدڵنیاییەوە و بڕینراوەتەوە کە نابێت هیچ پیاوێکی لە دینەکانی تر لەگەڵ بێت، نە لە خاوەن کتێبەکان، نە نەسرانی و جوولەکە نە جگە لەوانیش، بۆچی؟ لەبەر فەرموودەی الله تعالى لە سورەتی -آل عمران- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمۡ ١١٨﴾ واتە لە جگە لە خۆتان، بطانة: ئەم نزیککراوەیە لەناو شتەکە پێی دەوترێت (بطانة)، جا نزیکەکان لە دەسەڵاتدار پێیان دەوترێت: (بطانته)، الله عز وجل هەر کەسێکی کردبێتە دەسەڵاتدار دوو هاوڕازی بۆ داناوە و هاوڕازێکیان فەرمانی چاکەی پێدەکا و هانی دەدات لەسەری، ئەوی تریشیان فەرمانی پێدەکات بە خراپە و هانی دەدات لەسەری پەنا بە الله ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن

(١) دەقی فەرموودەکە بەم شێوەیە: "لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً" رواه البخاري

(٢) ئەم فەرموودەیە (البوصيريّ) باسی کردووە لە "إتحاف الخيرة المهرة" وە دەڵێت: (الطبراني) گێڕاویەتیەوە و لە سەنەدەکەیدا پیاوێك هەیە بەناوی "حسين ابن قيس" ناسراو بە "حَنَش"، لە زانایان هەیە فەرموودەکەی بە (ضعيف) داناوە و هەشیانە بە (حسن)ـی داناوە، ئیمامی (الترمذي) گێڕاویەتیەوە و فەرموودەکەی بە (حسن) داناوە و (الحاكم)یش گێڕاویەتیەوە و فەرموودەکەی بە (صحيح) داناوە، وە (ابن نمرة) بە هەمان شێوە پشتڕاستی کردووەتەوە، ئەم پیاوە جیاوازی و ناکۆکی هەیە لەبارەیەوە هەیانە فەرموودەکەی بە (ضعيف) داناوە و هەشیانە بە (حسن)، بەڵام بۆ ئەم فەرموودەیە ڕێگەیەك هەیە بەهێزی دەکات جگە لە ڕێگەی "حسين ابن قيس".

كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾[1] ، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەدەر لە خۆتان كەسێك مەگرنە دۆست و مەیكەنە جێی ڕازونیازی خۆتان و نهێنیەكانی خۆتانیان لا بدركێنن، چونكە ئەوان كۆڵ نادەن لە دروستكردنی تەنگانە و گیروگرفت و ناخۆشی بۆتان، ئاواتیان ئەوەیە دوچاری ئازار و كێشە ببن، بەئاشكرا ڕق وكینە لە دەمیاندا دەركەوتووە، ئەوەی لە سینەیاندا شاردویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی كە دەریدەخەن، بێگومان ئێمە نیشانە و بەڵگەمان بۆ دیاری كردوون (تا دۆست لە دوژمن جیابكەنەوە)، ئەگەر عەقڵ و ژیریتان بخەنە كار.

ئەمە سیفەتەكانە، بۆت نیە كەسێك بكەیتە هاوڕاز و نزیكت لە غەیری موسڵمانان، هەر بۆیە كاتێك ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) هاتە لای ئیمامی عمر (ﷺ) كە پیاوێكی لەگەڵدا بوو بابەتەكانی هەژماركردن و بەڕێوەبردنی ماددی باش دەزانی، نازانم ئەم ڕیوایەتەم لە كوێ خوێندووەتەوە بەم شێوەیە ئیمامی عمر وتی: بە ویستی الله تعالی -كاتێك بینی زیرەكە لە هەژماركردن- وتی: نوێژمان بۆ دەكات، ئەبو موسا وتی: ئەو نایەتە ناو مزگەوت ئەی پێشەوای ئیمانداران، وتی: ئایا لەشگرانە؟ وتی: نەخێر نەسڕانییە جا دەستی لەسەر قاچی دانا و وتی: ئایا الله دووریان دەخاتەوە و ئێوەش نزیكیان دەكەنەوە، وە الله زەلیلیان دەكات و ئێوەش سەربەرزیان دەكەن، وە الله نزمی كردوونە و ئێوەش ڕێزیان لێ دەنێن[2]، هەر بۆیە كاتێك بە ئیمامی عمر (ﷺ) وترا كە نەسڕانییێك هەیە شارەزایە لە بابەتەكانی كاروبارە ماددیەكان ئەگەر بیكەیتە نووسەری خۆت، ئایەتەكەی خوێندەوە و وتی: كەوایە لەبری ئیمانداران كەسێك دەكەمە هاوڕاز و نزیكم[3] ، ئەمە لە ئیسلام و ئەوەش لە دیموكراسی، بۆیە دیموكراسی هیچ پەیوەندییەكی بە ئیسلام نیە نە لە ڕووی پێناسەوە، و نە لە ڕووی دانانی دەسەڵاتداران، و نە لە ڕووی بەڕێوەبردنی كاروباری دەوڵەت، بەشی كۆتایی ماوەتەوە لە پێناسەكە لە دەستوری عێراقی و دەستوری میسڕی "وە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەكان و شەرعیەتیانە" ئەم شەرعیەتە چییە؟ ئەمە مانای ئەوەیە لە مافی گەلە كە حكومەت هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر ئەمەیان بوێت، ئەمەش بەپێی ئەو دەسەڵاتەیە دراوە بە گەل، وە بەپێی ئەو ئازادییەی هەیەتی، هەر بۆیە ئەگەر چاودێری ڕووداوەكانت كردبێت لە میسڕ، ئیخوانی میسڕ هەمیشە لە كەناڵە ئاسمانیەكان چی دەڵێن؟ "دەمانەوێت شەرعیەت بگەڕێتەوە"، شەریعەت نا بەڵكو

(١) آل عمران: ١١٨

(٢) -البيهقي- ئەم چیرۆكەی گێڕاوەتەوە لە (السنن الكبرى) بە جیاوازی لە هەندێك وشەكان و هەروەها -ابن القيم- لە (أحكام أهل الذمة ١/٤٥٤) گێڕاویەتیەوە.

(٣) ئیبن ئەبی حاتەم گێڕاویەتیەوە و -ابن كثیر-یش لەویەوە گواستویەتیەوە، وە چیرۆكەكە لێرەدا گێڕدراوەتەوە بە جیاوازی لە هەندێك وشەكان.

"شەرعیەت"، ئەم شەرعیەتە چییە؟ بەپێی قانونی میصری گەل ئەگەر کەسانێکیان هەڵبژارد بۆ حوکم ئەمە هەڵبژاردنێکی شەرعییە، وە مورسی لە لایەن گەلەوە هەڵبژێردراوە ئەمە هەڵبژاردنێکی شەرعییە چونکە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە، بەڵام سیسی ئەوا ئەمەیان بە ڕێگەیەکی ناشەرعی هاتووە، هەر بۆیە هەمیشە لە خۆپیشاندانەکان دەڵێن "دەمانەوێت شەرعیەت بگەڕێتەوە" واتە بگەڕێنرێتەوە بۆ حوکم ئەو کەسەی هەڵبژێردراوە لە لایەن گەل، چونکە "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکان و شەرعیەتیانە" جا ئەو کەسانەی هەڵدەبژێردرێن بۆ حوکم ئەوانە شەرعییەکانن لە حوکم کردندا، بەڵام ئەوەی بە جگە لەم ڕێگەیە هاتووە ئەوا ئەم حکومەتە ناشەرعییە وەك حکومەتی سیسی، کەوایە لە مافی گەلە کە حکومەت دووربخەنەوە یاخود متمانەی لێ بسێننەوە و هەڵیبوەشێننەوە.

جا ئەم ئازادییە بۆ گەل، کێ دۆزییەوە؟ جوولەکە، جوولەکە بوون کە ئەم جۆرەیان لە ئازادی بۆ گەل دۆزییەوە لە هەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکان، بەجۆرێك کە حکومەت بە شەرعی هەژمار ناکرێت تەنها ئەگەر لە لایەن گەلەوە دروست بوو بێت، سەرنج بدە جوولەکە چی دەڵێن لە پرۆتۆکۆلی یەکەم لە پرۆتۆکۆلەکانیان، دەڵێت: "ڕووتاندنی وشەی ئازادی وای لێ دەکات بتوانێت خەڵکی ئاست نزم و ژاوەژاوچی قایل بکات بەوەی حکومەت بێجگە لە بەرێوەبەرێك نوێنەرایەتی خاوەندار دەکات کە ئەویش گەلە، شتێکی تر نیە" پاشان وتیان: "وە دەکرێت لابردرێت و فڕێ بدرێت[1] وەك دوو دەستەوانەی کۆن و ڕزیو" باشە، کێ لایان دەبات؟ گەل، سەرنج بدە تەواوکەری پرۆتۆکۆلەکە "وە متمانە بوون بەوەی نوێنەرانی گەل دەکرێت لابرێن و دووربخرێنەوە، وا دەکات نوێنەرەکانیان بکەونە ژێر دەسەڵاتی ئێمە" کاتێك ئەم ئازادییە بە گەل دەدەن لە هەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکان ئەوانە (واتە ئەوانەی دوورخراونەتەوە لە لایەن گەل) دەکەونە باوەشی کێ؟ ئەوان دەڵێن دەکەونە باوەشی ئێمەوە، "وە متمانە بوون بەوەی نوێنەرانی گەل دەکرێت لابرێن و دووربخرێنەوە، وا دەکات نوێنەرەکانیان بکەونە ژێر دەسەڵاتی ئێمە، وە وا دەکات دانانیان بەکرداری لە دەستی ئێمە بێت" ئازادییان دا بە گەل بەوەی لە مافی خۆتانە کە متمانە لەم حکومەتە بسێننەوە و لایان ببەن، ئەم حکومەتەش هەتا نەکەوێت پێویستی بە سامان و داراییە، پێویستی بە ڕاگەیاندنە، پێویستی بە پاڵپشتیکردنە، سامان و ڕاگەیاندن و پاڵپشتی لە دەستی کێیە؟ لە دەستی جوولەکەیە، بە تایبەت لە وڵاتانی ئەوروپا، وە ئەوەت بیر نەچێت کە جوولەکە ڕێگەیەکیان هەیە لە هێنانی هەندێك کەس بۆ سەر حوکم، وە ئەمەش ئاشکرایە لەبەرچاوان لە وڵاتانی موسڵمانان، هەمیشە کەسانێکی شکستخواردوو و دۆڕاو دەهێنن و دەیانکەنە شتێك، ئەمەش

(١)واتە حکومەت

کاتێك دەيگەيەنن بۆ ئەم پلە و پۆستە نابێت سەرپێچی هيچ فەرمانێکيان بکات چونکە تەنها بە سەرپێچی کردن ئەوا پێشينەی بڵاو دەکەنەوە لە ڕۆژنامەکان و ئيتر پياوەکە کۆتايی پێدێت، بۆيە نابێت سەرپێچييان بکات لە فەرمانەکان بۆ پارێزگاری کردن لەو پێگەيەی پێی گەيشتووە، باشە.

کەوايە لە ديموکراسی: گەل حکومەتەکان هەڵدەوەشێننەوە، ئەمە لە ديموکراسی، باشە، بگەڕێوە بۆ لای ئيسلام، دەسەڵاتدارێك کە حوکم دەکات بەوەی الله عز وجل دايبەزاندووە ئايا موسڵمانان بۆيان هەيە -ناڵێم گەل- موسڵمانان يان پەيمان پێدراوەکان (لە خاوەن کتێبەکان) ئەوانەی لە خاکی ئيسلام دەژين کە بەدەستی خۆيان سەرانە دەدەن و ملکەچ دەبن، ئايا بۆ ئەوانە هەيە خەليفە دوور بخەنەوە يان ئيمارەتەکە هەڵبوەشێننەوە؟ مەحاڵە، تەنها لە يەك حاڵەتدا: ئەگەر کوفری ئاشکرای لێ بەديار کەوت -پەنا بە الله- ئەويش نەك خاوەن کتێبەکان بەڵکو موسڵمانان کار دەکەن بۆ دوورخستنەوەی ئەم دەسەڵاتدارە ئەگەر کوفرێکی لێ بەديار کەوت ئەمە مەرجێکە، وە ئەم کوفرەش ڕوون و ئاشکرا و ديار بێت، وە مەرجی دووەم: بەڵگەمان لە شەرع لەبەردەست بێت لەسەر ئەوەی ئەم قسەيە يان ئەم کارەی لەو دەسەڵاتدارە دەرچووە کوفرە، بۆيە مەرجەکان بەم شێوەيەيە: کارێك يان قسەيەکی کوفری لێ دەربچێت، وە دووەم شت ئەوەيە بەڵگەمان لەبەردەست بێت لەسەر ئەوەی ئەمە کوفرە، فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کاتێك پێی وترا دەربارەی دەرچوون لە دەسەڵاتداران فەرمووی: "إلا أن تروا كفرا بواحاً عندكم من الله فيه برهان"[1] واتە: مەگەر ئەوەی کوفرێکی ئاشکرا ببينن کە لە لای الله بەڵگەتان هەبێت لەبارەيەوە.

کەوايە تەنها لەم حاڵەتەدا موسڵمانان -نەك گەل و نەك پەيمان پێدراوەکان- کار دەکەن لەسەر لادانی ئەو دەسەڵاتدار و پێشەوايە، بەڵام ئەگەر ستەمی کرد يان لە خەڵك بدات يان پارە و سامان بسەنێت، بۆ موسڵمانان نيە دەربچن لەو دەسەڵاتدارە يان لايبدەن چونکە ئەو خراپەکارييەی لە دەرچوونەکە دەکەوێتەوە چەند هێندەی ئەو ستەمە دەبێت کە ئەو دەيکات، وە چەند هێندەی خراپەی پارە و سامان لێسەندن يان لێدان لە پشت دەبێت، بۆيە بە بەراوردکردن لە نێوان خراپە و زيانی دەرچوون لێی و خراپە و زيانی ئارامگرتن لەسەری، ئارام دەگرين لەسەر ئەوەی لێی دەردەچێت چونکە ئەمە خراپەيەکی بچووکە لەچاو خراپەی دەرچوون لێی، جا بەراورد بکە لە نێوان ئەوەی لە ئيسلام هەيە و ئەوەی لە دەستوری عێراقی و دەستوری ميسڕی هاتووە تاوەکو بزانيت ئيسلام لە کوێی ديموکراسييە و ديموکراسيش لە کوێی ئيسلامە.

(١) متفق عليه

کەوابوو ئەو دووانە دوو دینی جیاوازن و بەیەك ناگەنەوە، دوو دینی جیاوازن، دیموکراسی دینێکە بەڵام ئیسلام دینێکی ترە، بۆیە ناگەینەوە بە دیموکراسی نە لە لایەنی پێناسەوە و نە لە لایەنی دەسەڵات دان بە گەل، وە نە لە لایەنی هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران بۆ گەل و نە لە لابردنی دەسەڵاتدارانیش لە لایەن گەل، لە هەموو ئەو خاڵانەدا ئیسلام ناگاتەوە بە دیموکراسی بە هیچ هۆکارێك یاخود بە هیچ بەستەرێك لە بەستەرەکانی پەیوەندی، لە نێوان ئیسلام و دیموکراسیدا هەرگیز هیچ پەیوەندییێك نیە لەو خاڵانەی باسم کرد، ڕوونە إن شاء الله، (ئامادەبووان) : إن شاء الله.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وتاری**

**شێخ ئەبی عەلی ئەنباری** -تقبه الله-

**بەناونیشانی**

**دیموکراسی و پەیوەندی بە ئیسلام**

**وەرگێڕانی**

**پێگەی ڕاستەڕێ**

